## ناساندنی خاوەنی بیروباوەڕ

ناوی : أحمد بن عمر بن سريج البغدادي القاضي الشافعي .

کونیەکەی : أبو العباس .

ناسراوە بە : ابن سريج .

لەدایکبووی : ٢٤٥ هـ .

وەفاتی : ٣٠٦ هـ .

### ستایشکردنی :

- ابن القيم لە (اجتماع الجيوش) دەڵێت : پێشەوای شافعیەکان بووە لە سەردەمی خۆیدا .

- الذهبي دەڵێت : ئیمام و شێخی ئیسلام و فەقیهی عێراقیەکان، گەشتووە بە هاوەڵانی سفيان بن عيينة و وكيع، وە فیقهی وەرگرتووە لە أبي القاسم عثمان بن بشار الأنماطي هاوەڵی المزني، وە بەوە مەزهەبی شافیعی بڵاوکردەوە لە بەغداد، سەرۆکی دادوەرەکان بوو لە شیراز و فەزڵی دەدرێت بەسەر هەموو هاوەڵانی شافیعیدا .

فەقیهـ أبو سعد عبد الواحد بن محمد وتی: گوێم لە هەندێک لە شێخەکانمان بوو لە لێکۆڵەرەوان و پابەندبووان بە ئەثەر، وە لەوەی سەدەی یەکەم لەسەری بوون، دەڵێت: پرسیار کرا لە ابن سريج دەربارەی سیفەتەکانی الله و تەوحیدەکەی، وتی :

بە تەوفیقی الله دەڵێم :

**١** - حەرامە لەسەر عەقڵەکان نمونە بۆ الله دابنێن، وە لەسەر خەیاڵەکان سنوری بۆ دابنەن، وە لەسەر گومانەکان کە بیبڕن، وە لەسەر شاراوەکان کە تێیدا ورد ببنەوە، وە لەسەر نەفسەکان کە بیری لێ بکەنەوە، وە لەسەر فیکرەکان کە بە تەواوی بیناسن، وە لەسەر خاوەن ژیرییەکان کە وەسفی بکەن، جگە لەوەی کە خۆی وەسفی خۆی پێ کردووە لە کیتابەکەیدا، یان لەسەر زمانی نێردراوەکەی ﷺ .

**٢** - بەڕاست دانراوە و جێگیر کراوە و ڕوون کراوەتەوە لەلایەن هەموو ئەهلی دین و سوننە و جەماعە لە سەلەفی ڕۆشتوو و هاوەڵان و تابعین و تابعی تابعین لە پێشەوایانی هیدایەتدەر و ڕێنیشاندەر و ناسراو تا ئەم زەمانەی ئێمە کە هەموو ئەو ئایەتانەی هاتوون لەلایەن الله وە دەربارەی ذاتی خۆی و سیفەتەکانی، وە هەواڵە ڕاستەکان کە هاتووە لەلایەن رسول الله ﷺ دەربارەی الله و سیفەتەکانی کە ئەهلی نەقڵ بە ڕاستیان داناوە و نوقڵادەکانقب وڵیان کردووە و جێگیریان کردووە، واجبە لەسەر پیاوی موسڵمانی ئیمانداری بەیەقین کە ئیمان بە هەموو ئەوانە بهێنێت وەکچۆن هاتووە، وە ڕادەستکردنی کارەکە بۆلای الله وەکچۆن فەرمانی پێ کردووە، وە پرسیارکردن دەربارەی واتاکانیان بیدعەیە - واتە واتای ئایەت و فەرموودەکانی سیفات ڕوونە، پێویست ناکات

پرسیاریان دەربارە بکرێت، چونکە دەستی الله واتە دەستی الله، واتاکەی ڕوونە، الله تعالى لەسەر عەرش بەرزبووەتەوە واتا الله تعالى لەسەر عەرش بەرزبووەتەوە، واتاکەی ڕوونە، ئەوە جەهمی و موعتەزیلی و ئەشعەریەکانن کە دێن تەحریفی ئایەت و فەرموودەکان دەکەن و لەسەر ڕووکەش وەرناگرن و واتاکەی دەگۆڕن، وەک چۆن کاتێک کەسێک پرسیاری ئایەتی پێنجی سوورەتی طه (ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ) لە أبو زرعة الرازي دەکات یەکسەر أبو زرعة توورە دەبێت چونکە مانای ئایەتەکە ڕوونە و پێویست بە پرسیارکردن ناکات، چونکە جەهمی و ئەشعەریەکان ئەڵێن واتای دەست چییە؟ پاشان ئایەتەکە لەسەر ڕووکەش وەرناگرن و بگرە ڕووکەشەکەی بە کوفر و تەشبیهـ و تەجسیم دەزانن و دەڵێن دەست واتە هێز - ، وە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەش کوفر و زەندەقەیە، بۆ نمونە :

٣ - فەرمایشتی الله : (هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِي ظُلَلٖ مِّنَ ٱلۡغَمَامِ) [**البقرة** : ٢١٠] .

وە فەرمایشتی الله : (وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلۡمَلَكُ صَفّٗا صَفّٗا) [**الفجر** : ٢٢] .

وە فەرمایشتی الله : (ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ) [**طه** : ٥] .

وە فەرمایشتی الله : (وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ) [**الزمر** : ٦٧] .

٤ - وە هاوشێوەکانیان لەوانەی قورئان باسی کردووە وەک : لەسەرووبوون، وە نەفس، وە دەستەکان، وە بیستن، وە بینین، وە قسەکردن، وە چاو و تێڕوانین، وە ویست، وە ڕازی بوون، وە تووڕە بوون، وە خۆشویستن، وە ڕق لێ بوونەوە، وە نەرم و نیانی، وە نزیک بوونەوە، وە دوور خستنەوە، وە تووڕە بوون، وە شەرم کردن، وە نزیک کردنەوە بە ئەندازەی کەوانێک یان نزیکتر، وە بەرزبوونەوەی قسە باشەکان بۆلای، وە بەرزبوونەوەی فریشتەکان و جبریل بۆلای، وە دابەزینی قورئان لەلایەوە، وە بانگکردنی پێغەمبەران، وە قسەی بۆ

فریشتەکان، وە گرتنەوە و بەخشینی، وە زانستی، وە تاکوتەنیایی، وە قودرەت و ویستی، وە تاکێتی، وە سەرەتایی و کۆتایی، وە بەوەی دەرەوە و ناوەوە شارەزایە، وە ژیان و مانەوەی، وە ئەزەلیەت و هەتاهەتایی، وە نور و خۆدەرخستنی، وە ڕووی، وە لای، وە لاقی، وە درووستکردنی ئادەم بە دەستی خۆی، وە وەسف و ستایشی، وە مەکری، وە سەرکەوتن و زاڵبوونی .

---

: ئەمانە هەمووی سیفەتی الله تعالی ـن کە وەسفی خۆیی پێ کردووە، وە سەلەف رحمهم الله لەسەر ڕووکەش واتاکەیان وەرگرتووە، بۆ نموونە (الفوقیة : لەسەرووبوون) واتە الله تعالی لەسەروو ئێمەوەیە و لەسەر عەرشە، وەکچۆن دەفەرموویێت (ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ) [طه : ٥] .

٥ - وە نموونەی فەرمایشتی الله : (ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ) [**الملك** : ١٦] .

وە فەرمایشتی الله : (وَهُوَ ٱلَّذِي فِي ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٞ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَٰهٞۚ : واتە هەر ئەو لە ئاسمان و زەوی پەرستراو و خوایە) [**الزخرف** : ٨٤] .

وە بیستنی الله لە غەیری خۆیەوە، وە بیستنی غەیری خۆی لێیەوە .

وە جگە لەمانەش لە سیفەتە پەیوەستەکانی کە باسکراوە لە کتێبی دابەزێنراو لەسەر پێغەمبەرەکەی ﷺ .

٦ - وە هەموو ئەوانەی نێردراوەکەی ﷺ وتویەتی دەربارەی سیفەتەکانی وەک :

درووستكردنی بەهەشتی فیردەوس بە دەستی خۆی، وە داری طوبی بە دەستی خۆی، وە نوسینی تەورات بە دەستی خۆی، وە قاچ خستنە سەر دۆزەخ تا دەڵێت : بەسە بەسە، وە پەنجەکان، وە پێکەنین، وە سەیرلێهاتن، وە دابەزین هەموو شەوێک بۆ ئاسمانی دونیا، وە شەوی جومعە، وە شەوی ناوەڕاستی مانگی شەعبان، وە شەوی قەدر، وە غیرەتی الله، وە خۆشحاڵی بە تەوبەکردنی بەندە، وە داپۆشراوی بە نور، وە داپۆشراوی بە پەردەی خۆبەگەورەزانین، وە الله کوێر نیە، وە الله پیشانی دەدرێت ئەوەی حەزی لێی نیە سەیری ناکات، وە هەردوو دەستی ڕاستن، وە هەڵبژاردن و گرتنی ئادەم بە دەستی ڕاست، وە فەرموودەی گرتن، وە هەموو ڕۆژێک سەیرکردنی لەوحی مەحفوظ، وە ڕۆژی قیامەت بە سێ مشت لە مشتەکانی الله دەیانخاتە بەهەشتەوە .

٧ - (کاتێک ئادەمی درووست کرد، مەسحی پشتی کرد بە دەستی ڕاستی، مشتێکی هێنا، فەرمووی ئەمە بۆ بەهەشت و گرنگ نیە بەلامەوە، هاوەڵانی ڕاست، وە مشتێکی تری هێنا، فەرمووی ئەمە بۆ دۆزەخ و گرنگ نیە بەلامەوە، هاوەڵانی چەپ، دواتر گەڕاندنیەوە بۆ پشتی ئادەم) .

٨ - فەرموودەی گرتن (دەریان دەهێنێ لە ئاگر کەسانێک کە هەرگیز کاری باشیان نەکردووە و ئاگر سوتاندوونی، دەگەن بە ڕووبارێک لە ڕوبارەکانی بەهەشت، پێی دەوترێت: ڕوباری ژیانەوە).

٩ - وە فەرموودەی ناولەپ کاتێک پێغەمبەر بەرزبوویەوە (ناولەپی دانا لە نێوان شانەکانم هەستم بە ساردی سەری پەنجەکانی کرد لە نێوان سنگم) .

١٠ - وە فەرمایشتی (پەروەردگارم بینی لەسەر باشترین شێوە).

١١ - وە فەرمایشتی (ئادەمی درووست کرد لەسەر شێوەی خۆی).

١٢ - (دەموچاو مەشێوێنن، الله ئادەمی درووست کرد لەسەر شێوەی الرحمن).

١٣ - وە جێگیرکردنی کەلام بە پیت و دەنگ، وە بە زمانەکان و وشەکان و سورەتەکان، وە قسەکردنی الله بۆ جبریل و فریشتەکان، وە بۆ فریشتەکانی ڕەحم - ئەو فریشتەیانەی کاتێک سێ مانگ لەکاتی ڕۆح بەبەرکردنی منداڵدا ڕزق و ئەجەل و هەندێک شتی دیکەی بۆ دەنووسن بە ئیزنی الله عز وجل - ، وە بۆ فریشتەی مەرگ، وە بۆ رضوان، وە بۆ مالک، وە بۆ ئادەم، وە بۆ موسا، وە بۆ محمد، وە بۆ شەهیدەکان، وە بۆ ئیمانداران لە ڕۆژێ لێپرسینەوەدا، وە لە بەهەشتدا، وە دابەزینی قورئان بۆ ئاسمانی دونیا، وە بوونی قورئان لە موصحەفەکاندا.

١٤ - (الله بیستنی ڕانەگرتووە بۆ هیچ شتێک بەوێنەی ڕاگرتنی بیستنی بۆ پێغەمبەرێک کە قورئان دەخوێنێتەوە) .

١٥ - (الله زیاتر و بەهێزتر بیستنی خۆی ڕادەگرێت بۆ قورئان خوێنێک زیاتر لە کەسێکی گۆرانی بێژ بۆ گۆرانییەکەی) .

١٦ - (الله پژمەی خۆش دەوێت، وە ڕقی لە باوێشکە) .

١٧ - وە الله صەبری پێ خۆشە و خۆشی دەوێت، وە لێبووەتەوە لە ڕزق و ئەجەلەکان .

**١٨** - وه فەرموودەی سەربڕینی مردن، وە شانازی کردنی الله تعالی، وە بەرزبوونەوەی وتە و کردار و ڕۆحەکان بۆلای .

**١٩** - وه فەرموودەی میعراج بە لەش و دەروونی، وە سەیرکردنی بۆ بەهەشت و دۆزەخ، وە گەشتنی بە عەرش، وە سەروو عەرش تا ئەوەی نێوان ئەو و الله هیچ نەبوو جگە لە پەردەی عیززەت، وە پیشاندانی پێغەمبەران بۆی، وە پیشاندانی کاروکردەوەی ئوممەتەکەی بۆی .

**٢٠** - وە جگە لەمانەش لەوانەی دروستن لەوەوە ﷺ لە هەواڵە لێکچووە هاتووەکان دەربارەی سیفەتەکانی الله لەوەی پێی گەیاندووین، وە لەوەشی درووستە و پێی نەگەیاندووین، بیروباوەڕمان تێیدا لەم ئایەتە لێکچووانەی قورئاندا ئەوەیە کە :

قبوڵی دەکەین و ڕەتی ناکەینەوە و تەئویلی ناکەین بە تەئویلی پێچەوانەکاران، وە نایخەینەسەر تەشبیهی موشەبیهەکان، بۆی زیاد ناکەین و لێشی کەم ناکەینەوە، وە تەفسیری ناکەین، وە چۆنێتی بۆ دانانێین، وە سیفەتەکانی وەرناگێڕینە سەر زمانێکی غەیری عەرەبی، ئاماژەی پێ نادەین بە خەیاڵی دڵەکان، وە بە جوڵەی ئەندامەکان [١]، بەڵکو دایدەنەین ئەوەی الله جل جلالە دایناوە، وە تەفسیری دەکەین بەو تەفسیرەی پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی لەگەڵ هاوەڵان و تابعین و پێشەوایانی لێڕازی بوو لە سەلەف ناسراو بە دین و ئەمانەت، کۆدەبینەوە لەسەر ئەوەی ئەوان کۆبوونەتەوە لەسەری، خۆمان دەگرینەوە لەوەی ئەوان خۆیان لێ گرتووەتەوە، وە ڕادەستی ڕووکەشی هەواڵەکە دەبین، وە ئایەتیش بۆ ڕووکەشەکەی دابەزیوە، قسە ناکەین بە

تەئویلی موعتەزیلە و ئەشعەری و جەهمی و مولحید و موجەسیمە و موشەبیهە و کەڕامی و موکەییفە .

بەڵکو قبوڵی دەکەین بەبێ تەئویل، وە ئیمانی پێ دەهێنین بەبێ تەمثیل.

وە دەڵێین ئایەت و فەرموودە ڕاستن، وە ئیمان هێنان پێیان واجبە، وە قسەکردن پێیان سوننەیە، وە گرتنبەری تەئویل بیدعەیە.

---

[١] : جێگیر بووە لە فەرموودەی صحیح ئاماژەکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ سیفەتەکان بە ئەندامەکانی، وەک ئاماژەکردن بۆ بیستن و بینینی کاتێک فەرمایشتی (وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ) [الشورى : ١١] دەخوێندەوە، وە ئاماژەکردنی بۆ پەنجەکانی لەکاتی فەرمایشتی (دڵەکانی بەندەکان لەنێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی الرحمن دان)، وە جگە لەمەش کە هاتووە لە سوننەتدا، ئەم ئاماژەپێدانەی بە ئەندامەکانی بۆ سیفەتەکان بۆ جێگیرکردنی حەقیقەتی سیفەتەکانی الله یە بەبێ تەشبیهـ و چۆنێتی بۆدانان، وە نکۆڵی لێ دەکەن و بە گەورەی دەزانن پەکخەری سیفەتەکان لە جەهمی و ئەشعەری یان ئەوانەی پێیان کاریگەر بوون .

وە وتەی : (ڕادەستی ڕووکەشی هەواڵەکە دەبین) واتە : مانای ڕووکەشی ئایەت یان فەرموودەکانی سیفات وەرئەگرین، بەم شێوەیە خۆمان بەری ئەکەین لە هەموو ئەو کۆمەڵ و تاقمە کوفریانەی کە إبن سريج لە کۆتایی عەقیدەکەیدا ناوی هێناون .